www.Gizing.net

# نیقاب

## واجبێکی فەرامۆشکراو




نووسینی

ڕێباز جەمال

پێداچوونەوەی

پێشەوا ئیبراهیم

وعن أسماء بنت أبى بكر رضي الله عنهما قالت :

كنا نُغطِّي وجوهنا من الرجال، وكنا نمتشط قبل ذلك في الإحرام [1]

**واتە:**

**لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە (ڕەزای خودایان لێبێت) دەڵێت:**

**ئێمە ڕووخسارمان لە پیاوان دادەپۆشی، پێش ئێستا لە ئیحرام دەرمان دەخست .**

١- رواه ابن خزيمة (203/4)، والحاكم (624/1) وصححه ووافقه الذهبي، وصححه الألباني في كتاب جلباب المرأة المسلمة .

# پێشکەشە

★ بە "ئەو"

★ بەو ئافرەتانەی دەیانەوێ گۆشکراوی شەریعەتی ئیلاهی بن .

★ بەو خوشکانەی پابەندبوون بە باڵاپۆشی شەرعییەوە ڕووی گەشیانە .

★ بەو دایکانەی منداڵەکانیان وەك دایکیان عائیشە ئاسا پەروەردە دەکەن .

# پێشەکی

الحمدلله تعالی والصلاة والسلام على رسول الله تعالى (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم)، وبعد...

**بەبێگومان ئەم باس و بابەتی بالأپۆشی تەواو و نیقاب و پێچەکردن ئێستا لە ناو کۆمەڵگای موسڵمان نشین نامۆ و فەرامۆشکرا و نەزانراو و نەناسراوە، تەنانەت بە شێوەیەکی وا ئەگەر بێت و ئافرەتێك لەشوێن مەنهەجە پاکەکەی ئیسلامبێت و پەیوەست بوونی خۆی بە پۆشتەیی و جلی تەواو شەرعی ڕابگەیەنێت ئەوا لە لای زۆرینەی خەڵکی بە دواکەوتوو و کۆنەپەرست و کەلتور پەرست ئەژمار دەکرێت، ئێستا موسڵمانان بەهۆی پاڵەپەستۆی زۆری بێباوەڕانەوە لەهەموو ڕوویێکەوە شوێن کەوتوویی بۆ پێغەمبەری خودا** (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم) **بە پاش کەوتوویی دەزانن و شوێن کەوتوویی ڕۆژئاواو و بێباوەڕان بە پێشکەوتن و پێشکەوتوویی دەزانن.**

**سەرۆکی پێشووتری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (جورج دبليو بوش) لە وتارێکیدا لە کۆنگرەی (الإتحاد اليهودی والمسيحی)لە ساڵی 2002 وتی:** (سنحلق لحي الرجال.. وننزع حجاب النساء.. وندخل أفلام الجنس إلى غرف نومهم) **واتە: ڕیشی پیاوانیان دەتاشین.. وە ناکۆکی و کێشە دەخەینە حیجابی ئافرەتانیان.. وە فیلمە بەدڕەوشت و جنسیەکان دەبەینە ژووری خەوتنیانەوە .**

**بەبێگومان وایان کرد، کاتێك کۆمەڵگای ئیسلامی دەبینین و ئافرەتانیان پەیوەست نین بە جل و بەرگی شەرعی ئەوە تەنها ئەمە ناگەیەنێت کە خەڵکەکە ئیسلامی ناوێت، نەخێر بەڵکو ئەمە مانای ئەوەیە تێگەیشتنی ڕاست و دروست بۆ ئیسلامیەتی و موسڵمان بوون کاڵ بۆتەوە، دەیان جل و بەرگی ناشەرعی کراونەتە جل و بەرگی شەرعی، ئەوە شتێکی ڕوونە کە حیجابی شەرعی مەرجەکانی ئاشکرا و دیارە، ئەو جل و بەرگانەی ئێستا ناونراون بە جلی شەرعی و حیجاب بێگومان زۆر دوورن لە حیجاب و جلی شەرعی.**

**پێغەمبەری خودا** (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم) **دەفەرمووێ:** (صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا : قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ ، مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ ، رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ ، لاَ يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلاَ يَجِدْنَ رِيحَهَا ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا) [2] .

---

٢– رواه مسلم .

**واتە: دوو کۆمەڵ دۆزەخین، ئەوانم نەدیووە. کۆمەڵێك قامچیان بەدەستەوەیە وەك کلکی چێڵ(مانگا) وایە پێی لە خەڵکی دەدەن. ئەوی دیکە ئەو ئافرەتانەن کە پۆشاکەکانیان لەبەردایە بەڵام هەر رووت دیارن. ئەوانەی بە لار و لەنجە دەڕۆن بە رێوە، قژی سەریان وابەستاوە وەك قۆپکەی سەر پشتی حوشتر وایە، ئەوانە ناچنە بەهەشت، وە بۆنی بەهەشت ناکەن، هەرچەندە بۆنی بەهەشت چەندەها ساڵە رێ دەڕوات.**

**لە فەرموودەیەکی تر** (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم) **دەفەرموویێت:** (سَيَكُونُ آخَرَ أُمَّتِي نِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ ، عَلَى رُءُوسِهِنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ ، الْعَنُوهُنَّ ، فَإِنَّهُنَّ مَلْعُونَاتٌ) [3]

**واتە: لە کۆتایی ئوممەتی من ئافرەت پەیدا دەبن پۆشاکیان لەبەرە بەڵام ڕووت دیارن، قژی سەریان وەك پشتی حوشترە، ئەوانە بە نەفرەت بکەن، چونکە نەفرەتیان لێکراوە.**

**بەڵێ پێغەمبەری خۆشەویست** (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم) **ڕاستی فەرموو، کورد وتەنی(ئەوەی نەبوو بوو، وە ئەوەی نەمان دیبوو دیمان). ئەم پەرتووکە پوخت و کورتەی ئێستا لە بەردەست دایە بەڕاستی هەگبەیەکی خنجیلانەیە بۆ خوشکان و دایکانی موسڵمان تا شێوە و ڕوو و رووخساری دەرەکیان وەك ئەوە بێت کە خودای پەروەردگار(تبارك وتعالى) و پێغەمبەری خودا** (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم) **فەرمانیان پێکردووە، نامەیەکی کراوەی کورت و ڕوونە بۆ خوشکان تا بە شێوەیەکی سانا ئاشنا بن بە جلی شەرعی، ئەو جلەی دایکیان عائیشە و خوشکیان فاتیمە(ڕەزای خودایان لەسەر بێت) پۆشیویانە و ئافرەتانی پێشین دەستیان پێوە گرتووە، ئومێدم وایە ناوەڕۆکی ئەم نامەیە ببێتە ناسنامەی زۆرێك لەخوشکان ودایکان، هیوام وایە خوشکان و دایکیان بە دەست گرتن بەو پۆشاکە شەرعیەی کە لەم نامەیدا خراوەتە ڕوو پێغەمبەری خودا** (صلى الله تعالى عليه وعلى اله وسلم) **دڵ خۆش کەن. خودا** (عز وجل) **پاداشتی بەخێری نوسەری ئەم نامە کورت وپوختە بداتەوە و بۆی بخاتە سەر تەرازووی کردەووە چاکەکان. لە کۆتا پەیڤدا دەڵێم:**

**جلێك پۆشینی فەرمانی خوابێ　　بەکردنە بەری بەهەشت دانرابێ**
**خوشك و دایکی من پەلەکە و زووکە　　بیکە بەری خۆت تا رۆحت مابێ**

وسبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا أنت استغفرك وأتوب إليك، وصل اللهم على محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليما كثيرا. والحمد لله تعالى رب العالمين.

**پێشەوا ئیبراهیم**

**٢ جمادی دووەمی ١٤٣٤**

3 – رواه الطبراني،1127.

## پێناسەی حیجاب

**لەزمانەوانییدا: بریتیە لە داپۆشین و ستر کردن و شاردنەوە، نێوانی هەردووشتێك پێی دەوتریێت حیجاب، کە ئەمەیان ڕوونە و قسەی لەسەر نییە.**

**لەشەرعدا: پێناسەی زۆری بۆ کراوە کە گرنگترینیان ئەمانەن:**

- **حیجاب:** (هو ما تلبسة المرأة من الثياب والعباءة، وما اتخذته من حوائل بينها وبين الرجل الأجانب) [4].

**واتە: حیجاب بریتیە لە خۆداپۆشینی ئافرەت بە جل و عەبا، بۆ دروستکردنی پەردە لە نێوان خۆیی و پیاوانی بێگانەدا.**

- (الحجاب : لباس شرعی سابغ، تستتر به المرأة المسلمة، ليمنع الرجل الأجانب من رؤية شیء من بدنها) [(5)].

**واتە: حیجاب: جلێکی شەرعی داپۆشەرە، ئافرەتی موسڵمان دادەپۆشێت، پیاوانی بێگانە قەدەغەدەکات لە بینینی لاشەی.**

- **حیجاب** (ستر المرأة جميع بدنها، و منه الوجه، و الكفان، والقدمان، و ستر زينتها المكتسبة بما يمنع الأجانب عن رؤية شيء من ذلك...) [(6)].

**واتە: دەڵێن: داپۆشەری هەموو جەستەی ئافرەتە، لەوانە ڕووی(دەم وچاو)، وە دوو دەستەکانی، وە دوو پێیەکانی، وە داپۆشەری جوانییە دیارەکانی ئافرەتە و پیاوانی بێگانە قەدەغە دەکات لە بینینی...**

- **حیجاب: ئەوەیە کە هەموو جەستەی ئافرەتی موسڵمان دادەپۆشێت لە بینینی پیاوانی بێگانە: بریتیە لە جلێکی فراوانی داپۆشەری هەموو جەستە و ڕووخساری ئافرەت** [(7)].

٤– بڕوانە: معجم لغة الفقهاء للرواس، ص153

٥– حجاب المرأة المسلمة بين انتحال المبطلين وتأويل الجاهلين، للدكتور محمد فؤاد البرازي، ص 30.

٦– حراسة الفضيلة، لبكر أبو زيد، ص 29.

٧– إضهار الحق والصواب في حكم الحجاب، للدكتور سعيد القحطانی،ص7.

## پێناسەی جلباب

پێناسەی (الجلباب) لای شەرعناسان: بریتیە لەو داپۆشەرەی یان لەو پەردەیەی یان لەو عەبایەی کە دەدرێت بەسەر جلدا، هەروەکو ئەوەی پێشەوا نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) ڕوونی کردۆتەوە.[8]

پێشەوا ئیبن و حەزم (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەربارەی (الجلباب) دەڵێت: (والجلباب في لغة العرب التي خاطَبنا بها رسول اللَّه_صلى الله عليه وسلم_ ، هو ما غَطَّى جميع الجسم لا بعضه)[9].

واتە: - الجلباب - لە زمانی عەرەبیدا ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا(ﷺ) پێی فەرمووین، بریتیە لە داپۆشەری هەموو جەستە نەوەك هەندێکی.

وە پێشەوا قورتوبی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەلێت: (والصحيح أنه الثوب الذي يستر جميع البدن)[10].

واتە: لە ڕاستیدا (الجلباب) جلێکە داپۆشەری هەموو جەستەیە .

## پێناسەی نیقاب

نیقاب: بریتیە لەوەی کە ئافرەت خۆی پێ دادەپۆشێت، وەکو ئەوەی دەڵێن: ئەو ئافرەتە خۆی داپۆشی بەوەی ڕووخساری خۆی شاردەوە، وە جیاوازی لە نێوان حیجاب و نیقاب بریتیە لەوەی: حیجاب داپۆشینی هەموو جەستەیە، بەڵام نیقاب داپۆشینی ڕووخسارە بەتەنها.

---

٨- المجموع شرح المهذب، 3/ 172.
٩- المحلى، 3/ 212.
١٠- إظهار الحق والصواب في حكم الحجاب،ص11.

## مەرجەكانی بالاّ پۆشی[11]

**یەكەم: جلەكە هەموو جەستەی بەتەواوی داپپۆشیت .**

**دووەم: جلەكە لەخودی خۆیدا ڕازاوە نەبێت.**

**سێیەم: جلەكە ئەستور بێ و تەنك نەبێت بە شێوەیەك ژێرەوەی جلەكە دیاربێت.**

**چوارەم: جلەكە فراوان بێت وتەسك نەبێت بە جۆرێك ئەندامەكانی لاشەی دەرخا.**

**پێنجەم: جلەكە بۆندار نەبێت بە هەر یەكێك لە بۆنەكان.**

**شەشەم: نابێت جلەكە لە جلی پیاوان بچێت و وەك جلی پیاوان بێت.**

**حەوتەم: نابێت جلەكە لە جلی بێباوەڕان بچێت و وەك جلی ئەوان بێت.**

**هەشتەم: نابێت جلەكە بۆ ناو و نازناو و ناوبانگ بێت.**

**نۆیەم: نابێت جلەكە شێوە و وێنەی (سەلیبی) نەسرانییەكانی لەسەر بێت.**

**دەیەم: نابێت جلەكە وێنەی لەسەر بێت و وێنەی لەسەر كێشرابێت[12].**

---

١١– تێبینی: لەبەر ئەوەی باسەكەی ئێمە (نیقابە) بەو مانایەی باسی واجب بوونی داپۆشینی (دەستەكان و دەم و چاو)دەكەین، بۆیە بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر مەرجەكانی حیجابمان پێش بەڵگەكان خست، هەرچەندە نیقابیش یەكێكە لەمەرجەكانی حیجاب كە ئەمیش بریتیە لە داپۆشینی تەواوی جەستە بە (رووخسار و دەستەكان)یشەوە.

١٢– إضهار الحق والصواب في حكم الحجاب.

## ڕێخۆشکەریەك پێش چوونە ناو بەڵگەکانەوە

زانایانی کۆن و ئێستا ڕاجیایی و ناکۆکیان هەیە لەسەر دەرکەونتی رووخسار(دەم و چاو)ی ئافرەت، بە سەیری کردنی مێژووی ئەم باسە دەبینین زانا هەیە پێی وایە کە دەرکەوتن و دەرخستنی رووخسار(دەم و چاو)ی ئافرەت دروست و ڕێپێدراوە، وە لە بەرامبەریدا دەبینین زاناگەلێك ئەمەیان رەتکردۆتەوە و قەدەغەی دەرکەوتن و دەرخستنیان کردووە، لەهەمان کاتدا لەگەڵ ئەم هەموو مشتومڕ و ناکۆکییەی نێو زانایان کە سەیری خەڵکانی موسڵمان دەکەین لەم هەقیقەتە دوورن و ئاگایان لێی نییە، لەهەمووی گەورەتر ئەوەیە هەموو کات لە باسی (مەرجەکانی نوێژ)دا ئاماژە بە عەورەتی ئافرەت دەکرێت بۆ دروستیەتی و نادروستیەتی نوێژ. بە شێوەیەکی گشتگیر زانایان دەڵێن: هەموو لاشە و جەستەی ئافرەت عەورەتە، بەڵام لەناو نوێژ حوکمی عەورەتەکە گۆڕانی بەسەردا دێت بەوەی (دەم و چاو لەگەڵ دەست) بەعەورەت ئەژمار نییە، ئەمەش لەهەموو کاتێکدا نا، بەڵکو تەنها لەناو نوێژدا، بەو واتایەی عەورەتی نوێژ پەیوەست نییە بە شوین و کاتی تر، وە ئەو شوێنانەی دەکرێ لەکاتی نوێژکردن بەدەرەوە بن تەنها (دەم و چاوە لەگەڵ هەردوو دەستەکان)، بەڵام لەهەمان کاتدا بۆچوونی ترمان هەیە دەڵێت: نابێت(دەم و چاو لەگەڵ دوو دەستەکان) لەناو نوێژدا داپۆشراو بن، بەڵکو دەبێت بەدەرەوە بێت. وە بۆچوونی تریش هەیە: سەبارەت بە(هەر دوو پێیەکان) کە بۆچوونی پێشەوا ئەبو حەنیفەیە(رەحمەتی خودای لێبێت) پێی وایە لەکاتی نوێژ کردندا (هەر دوو پێیەکان)یش بەدەرەوە بوونیان ئاساییە و بەعەورەت ئەژمارنین، کە ئەمە بۆچوونی بەهێزترە و ئەگەری ڕاستیەتی زیاترە، بەڵام جگە لەکاتی نوێژکردن بەهیچ جۆرێك دروست و ڕێپێدراو نییە(پێیەکان) دەربکەون و وەدەربخرێن.

کەواتا ئەگەر وترا: (دەم و چاو لەگەڵ دەستەکان عەورەت نین) ئەمە دەبێت بزانین مەبەستیان ئەوەیە لە ناو نوێژدا عەورەت نین ئەمەش بەو مەرجەی شوێنەکە پیاوی بێگانەی لێنەبێت، چونکە ئەگەر لێی بوو دەرکەوتنی( دەم و چاو لەگەڵ دەستەکان)یش ڕێگاپێدراو نییە و دروست نییە. هەروەك پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: (المرأة عورة) واتە: ئافرەت عەورەتە. کەواتا لە کاتی سەیرکردن لەلایەن کەسێکی بێگانە و نامەحرەم ئەوا هەموو جەستە و لاشەی ئافرەت عەورەتە و دەبێت داپۆشرێت، ئێمە لێرەوە پشتیوان بەخودای پەروەردگار بە کورت و پوختی راستیەکان و بەڵگەکانی پێویستیەتی بالأپۆشی تەواو وداپۆشینی دەستەکان ورووخسار(دەم و چاو) لە قورئان و سوننەت و بۆچوونی هەر چوار مەزهەبەکەی ئیسلام و زانایان بە گشتی دەخەینە ڕوو.

## بەڵگە لە قورئاندا

_ خودای گەورە دەفەرمووێ: (وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَبِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلالِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْبَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْنِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوْالتَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوْ الطِّفْلالَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلا يَضْرِبْنَبِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ) سورة النور / 31.

**واتە: وە بڵێ بە ئافرەتانی ئیمانداریش چاویان داخەن و بپارێزن (لەسەیرکردنی نامەحرەم)، وە عەورەتیان بپارێزن(لە داوێن پیسی)، وە جوانی خۆیان دەرنەخەن، جگە لەوەی بەدەرەوەیە و دیارە، وە با سەرپۆشەکانیان بدەن بە سینگ و بەرۆکیاندا، وە جوانی خۆیان دەرنەخەن بۆ مێردەکانیان نەبێت یان باوکیان یا باوکی مێردەکانیان یا کورەکانیان یا کوڕی مێردەکانیان یا براکانیان یا کوری براکانیان یا کوری خوشکەکانیان یا ئافرەتانی (ئیماندار) یا کەنیزەکانیان یا ئەو شوێن کەوتە و پیاوانەی کەبێ نیازن لە ئافرەت(وەك خزمەتکار و پیر و نەخۆش کە ئارەزووی ژن و مێردایەتیان نییە) یا ئەو منداڵە کوڕانەی کە ئاگایان لەلەش (عەورەت)ی ئافرەتان نەبێت(باڵغ نەبووبن)، (با ئافرەتان لە کاتی ڕۆیشتندا) قاچیان نەدەن بەزەویدا(تا دەنگی خرخاڵ و پاوانەکانیان بێت و) بزانرێت بەو جوانییەی پێیان کە شاردویانەتەوە، هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودا ئەی ئیمان دارەکان تا ڕزگار و سەرکەوتوو بن.**

_ وە هەروەها دەفەرمووێ: ( يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَأَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ) الأحزاب / 59.

**واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ بە هاوسەرانت و بە کچەکانت و بە ئافرەتانی بڕواداران با عەباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا(خۆیان وجوانیان پێ داپۆشن) ئەوە نزیکترە بناسرێن (بە داوێن پاك) تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن وە خودا لێخۆشبووی میهرەبانە.**

## بەڵگە لە سوننەتدا

- عن صفية بنت شيبة أن عائشة رضي الله عنها كانت تقول : لما نزلت هذه الآية ( وليضربن بخمرهن على جيوبهن ) أخذن أُزُرَهن (نوع من الثياب) فشققنها من قبل الحواشي فاختمرن بها.

" يرحم الله نساء المهاجرات الأول لما أنزل الله { وليضربن بخمرهن على جيوبهن } شققن أكثف مروطهن (نوع من الثياب) فاختمرن بها " . أي غطين وجوههن .[13]

**واتە: ئەو کاتە ئەو ئایەتە دابەزی** (وليضربن بخمرهن على جيوبهن) **جا لە دامێنی کراسەکانمان پارچەمان لێکردەوە روخسارمان پێ داپۆشی.**

**رەحمەتی خوا لە ژنە کۆچبەرەکانی سەرەتابێ کاتێ ئەو ئایەتە دابەزی پارچەیان لە کراسیان کردەوە کردیان بە پێچە، واتا دەموچاویان پێ داپۆشی.**

- عن عبد الله بن مسعود رضي الله عنه عن النبي (ﷺ)قال: ((المرأة عورة)) [14].

**واتە: لە عەبدوڵڵای کوری مەسعودەوە (رەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەرە(ﷺ) دەفەرمووێ: ئافرەت عەورەتە.**

- _ أَخْرَجَ الْبَزَّارُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي الْأَحْوَصِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ)قَالَ : (( الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ فَإِذَا خَرَجَتْ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ)) [15].

**واتە: لە عەبدوڵڵای کوری مەسعودەوە (رەزای خودای لێبێت) لە پێغەمبەرە(ﷺ) دەفەرمووێ: ئافرەت عەورەتە، هەر کات لە ماڵ چووە دەرەوە شەیتان سەرپەشتی دەکات.**

---

١٣- رواه البخاري ( 4481 ) ، وأبو داود ( 4102 ).

١٤- رواه الترمذي ورقمه (1173) وقال : حسن غريب .

١٥- رواه الترمذي ( 1173)، وقال الألباني في"" صحيح الترمذي " ( 936 ) : صحيح.

## بۆچوونی هەندێ لە زانایان

- ئیبنو لقودامەی مەقدسی(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت: (وقال مالك والأوزاعي والشافعي: جميع المرأة عورة إلا وجهها وكفيها، وما سوى ذلك يجب ستره في الصلاة) واتە: ماليك و ئەوزاعی و شافیعی وتویانە: هەموو لاشەی ئافرەت عەورەتە جگە لە دەم و چاو و دەستەکانی، جگە لەمانە پێویست و واجبە داپۆشرێت لە ناو نوێژدا.

ئەوە لەم قسەیە وەردەگرین کە بەڵێ لەناو نوێژدا تەنها (دەم و چاو و دەستەکان) داناپۆشرێت، بەڵام جگە لەنوێژ و لەدەرەوەی نوێژ هەموو شوێنەکان دەبێت داپۆشرێت، بەڵکو وەك ئەم زانا بەڕێزانە فەرموویان تەنها لەناو نوێژ داپۆشینی دەم و چاو و دەستەکان پێویست نییە، جگە لە نوێژ داپۆشینی هەموو لاشە وجەستەی پێویستە و واجبە.

- وە ئیبو لقەییم(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت: (العورة عورتان: عورة في الصلاة، وعورة في النظر، فالحرة لها أن تصلي مكشوفة الوجه والكفين، وليس لها أن تخرج في الأسواق ومجامع الناس كذلك) واتە: عەورەت دوو جۆرە: عەورەت لە نوێژدا، وە عەورەت لە سەیرکردندا، ئافرەت ئازادە لەکاتی نوێژکردندا رووخسار و هەردوو دەستی دەرخا، بەڵام بەڕاستی بۆی نییە دەرچێت بۆ دووکان و بازار و ناو خەڵکی بەم شێوەیە.

لەم قسەیەش ئەمە وەردەگرین: دوو جۆر عەورەتمان هەیە: یەکەمیان: عەورەت لەکاتی نوێژکردندا کە ئافرەت ئازادە رووخسار و دەستەکانی دیاربێت و دەریانخات، دووەمیان: عەورەت لە کاتی سەیرکردندا واتا لەدەرەوەی نوێژ ئینجا هەر کات و شوێنێك بێت بەهیچ شێوەیەك ئافەرت بۆی نییە رووخسار و دەستەکانی دیاربێت و دەیانخات.

- وە بەیضاوی(رەحمەتی خودای لێبێت) لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) دەڵَیَت: (والمستثنى هو الوجه والكفان لأنهما ليستا من العورة، والأظهر أن هذا في الصلاة لا في النظر، فإن كل بدن الحرة عورة، لا يحل لغير الزوج والمحرم النظر إلى شيء منها إلا لضرورة) واتە: رووخسار و دەستەکان لە عەورەت ئەژمار نین، وە رووکەشی و دیار ئەوەیە تەنها لە نوێژکردندا(رووخسار و دسەتەکان عەورەت نین)، نەوەك لە سەیرکردن، چونکە هەموو جەستەی ئافرەت عەورەتە، دروست نییە هیچ کەسێك هیچ لەلاشەی ببینن جگە لە مێرد و هاوسەر و مەحرەکانی، وە مەگەر بۆ کاتری زەرور.

لەم قسەیەش ئەوە وەردەگرین کە دەرخستن و دیاربوونی رووخسار و دەتەکانی ئافرەت لە نوێژدا رێپێدراوە بەو مەرجەی نامەحرەم و بیگانە نەیبینێت، بەڵام لە دەرەوەی نوێژ

**لەهەموو کاتەکانی دەرخستن و دیاربوونی ڕووخسار و دەستەکان دروست نییە، بەڵام ئاساییە ئافرەت ڕووخسار و دەستەکانی دەرخات لای مەحرەمەکانی وەکو( هاوسەری، باوکی، برای...).**

- **صەنعانی(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت:** (وبباح كشف وجهها حيث لم يأت دليل بتغطيته، والمراد كشفه عند صلاتها بحيث لا يراها أجنبي، فهذه عورتها في الصلاة، وأما عورتها بالنظر إلى نظر الأجنبي إليها فكلها عورة) **واتە: ڕێگەپێدراوە ڕووخساری ئافرە دیار بێت، چونکە هیچ بەڵگەیەك بۆ داپۆشراوی ڕووخساری نییە، لێرەدا دیاربوونی ڕووخساری ئافرەت مەبەستی لێی تەنها لەناو نوێژە بەڵام نابێت بێگانە و نامەحرەم بیبینێت، ئەمە عەورەتیەتی لەکاتی نوێژدا، بەڵام عەورەتی ئافرەت لە کاتی سەیرکردنی بیگانە بۆی ئەوکات هەمووڵاشەی ئافرەت عەورەتە.**

## شەرعناس و شەرعزانان:

**ئەوەی لە شەرعزانان بۆمان ماوەتەوە و لێیان وەرگیراوە کافی و بەسە بۆ سەلماندنی جیاوازی نێوان سنوری عەورەت و داپۆشراویەتی(حیجاب)، سەبارەت بەوەش کە هەندێ لەخەڵکی وتەی هەندێ زانای بەڕێز دەهێننەوە بەوەی بەدەرەوە بوون و دەرخستن و دەرکەوتنی ڕووخسار و دەستەکان دروست و ڕێپێدراوە، تەنانەت بۆچوونی وا هەیە دەڵێن: داپۆشراوی دەم و چاو لەگەڵ دەستەکان لە ئیسلامدا بوونی نییە، بەڵکو عادەت و تەقالیدی کۆنی پێش ئیسلامەتی و سەردەمی جەهالەت بوو!!**

**ئەمەی وا دەڵێن: دوو نەزانی لێ بەدی دەکەین:**

**یەکەم: نەزانی بەشەرعی خودای پەروەردگار بەوەی پێویستیەکی ئیسلام بە عادەتێکی کۆن و جەهالەت دەداتە قەڵەم.**

**دووەم: نەزانی و بێ ئاگایی لە فەرموودەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) و وتەی هاوەڵان و تابعین و تابعی تابعینی پێشنە چاکەکان و زانایانی گەورە و بەڕێزی ئیسلام.**

**هەڵویستی شەرعزانان:**

**هەڵویستی شەرعزانان و بەگشتی زانایان لەجیاوازی نێوان عەورەت لە نوێژ و لەغەیری نوێژ و کاتەکانی تر دوو بەشە:**

بەشی یەكەمیان: ئەوانەن كە دەرخستنی رووخسار و دەستەكان بەدروست نازانن جگە لە كاتی نوێژ كردندا، وە لەكاتی نوێژیش ئەگەر نامەحرەم وبێگانە ئامادەگی هەبوو لەم كاتەش دەرخستنی رووخسار و دەستەكان حەرام دەكەن.

بەشی دووەمیان: دەرخستنی رووخسار و دەستەكان لەهەموو كاتێكدا دروست و رێگەپێدراوە، وە بۆ پاڵپشتی قسەكانیان وتەی ئیبنوعەباس(رەزای خودای لێبێت) دەكەن بە بەلگە، كاتێك لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) دەڵێت: (الكحل والخاتم) واتە: ئەوەی رێگەپێدراوە دیاربێت (كل و ئەنگوستیلەیە). بەلاّم ئەم ئەسەر و گێڕانەوەیە لاواز(ضعيف)ە، چونكە لە ڕشتەی گێڕانەوەی فەرموودەكە (موسلیمی مەلائی) هەیە كە پێشەوا نەسائی دەربارەی دەڵێت: موسلیمی مەلائی كەسێكی وازڵهێنراوە لە گێڕانەوەی فەرموودا واتە(متڕك الحديث)ە.

وە لە گێڕانەوەیەكی تردا دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: (ما في الكف والوجه) واتە: ئەوەی رێگەپێدراوە دیار بێت رووخسار و دەستەكانە. ئەم گێڕانەوەش وەك ئەوەی پێشوو لاوازە، چونكە لە ڕشتەی گێڕەوانی فەرموودەكە (ئەحمەد عەتاردی) هەیە كە كەسێكی لاواز(ضعيف)ە لە گێڕانەوەی فەرموودەدا.

لەم دوو گێڕانەوە لاوازەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە ئەو تەفسیرەی دەدرێتە پاڵ پێشەوا ئیبنوعەباس(رەزای خودای لێبێت) دروست نین و لاوازن، هەروەكو ئیبنو عەدی (رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت: (رأيتهم مجمعين على ضعفه) واتە: بینیم زانایان رێككەوتوون لەسەر لاوازی ئەم ئەسەرە.

بەڵكو پێشەوا ئیبنو عەباس(رەزای خودای لێبێت) پێچەوانەی ئەمەی فەرمووە، لە تەفسیری ئایەتی(حیجاب): (يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلَابِيبِهِنَّ) پێشەوا ئیبنو عەباس(رەزای خودای لێبێت) دەڵێت: (أمر الله نساء المؤمنين إذا خرجن من بيوتهن في حاجة أن يغطين وجههن من فوق رؤوسهن بالجلابيب، ويبدين عينا واحدة) واتە: خودای گەورە فەرمانی بە ئافرەتانی موسڵمان كردووە، ئەگەر لە ماڵەكانیان دەرچوونە دەرەوە بۆ پێویستی و كارێك، ئەوا با رووخساریان داپۆشن لە سەر سەریانەوە بە عەباكا(جلباب)نیان، وە با تەنها یەك چاویان دیاربێت.

هەر چەند ئاماژەمان بەوەكرد ئەم ئەسەرانەی پێشوتر كە ئیبوعەباس دروستیەتی بە دەرخستنی رووخسار و دەستەكان دەدا لاوازن و بەبەلگە وەرناگیرێت لە لای ئەهلی عیلم وزانست، بەلاّم گریمان ئەسەرە لاواز نەبێت و ڕاست و صەحیح بێت ئەوكات خەڵكانێك دەپرسن چۆن دووقسەی دژ بە یەكی هەیە؟!!

**لە وەڵامدا دەڵێین: پێش دابەزینی ئایەتی(حیجاب) دروستیەتی بە دەرخستنی رووخسار و دەستەکان داوە، بەڵام کاتێك کە ئایەتی (حیجاب) دابەزی دەرخستنی قەدەغەکرد.**

**پێشەوا و شەیخ ولئیسلام ئیبنو تەیمییە(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت:** (والسلف تنازعوا في الزينة الظاهرة على قولين، فقال ابن مسعود: هي الثياب، وقال ابن عباس ومن وافقه: هي ما في الوجه واليدين، مثل الكحل والخاتم... وقبل أن تنزل آية الحجاب كان النساء يخرجن بلا جلباب، يرى الرجال وجهها ويديها، وكان إذ ذاك يجوز لها أن تظهر الوجه والكفين، وكان حينئذ يجوز النظر إليها لأنه يجوز إظهاره، ثم لما أنزل الله عز وجل آية الحجاب بقوله: { يا أيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن}. حجب النساء عن الرجال، وكان ذلك لما تزوج النبي صلى الله عليه وسلم زينب بنت جحش فأرخى النبي الستر ومنع أنسا أن ينظر، ولما اصطفى صفية بنت حيي بعد ذلك عام خيبر قالوا: إن حجبها فهي من أمهات المؤمنين، وإلا فهي مما ملكت يمينه، فحجبها... فإذا كن مأمورات بالجلباب وهو ستر الوجه أو ستر الوجه بالنقاب، كان حينئذ الوجه واليدان من الزينة التي أمرت ألا تظهرها للأجانب، فما بقي يحل للأجانب النظر إلا إلى الثياب الظاهرة، فابن مسعود ذكر آخر الأمرين، وابن عباس ذكر أول الأمرين" . إذاً لو صح قول ابن عباس في إباحة كشف الوجه واليدين فإنما ذلك كان قبل النسخ، ثم لما نزلت آية الحجاب أوجب الله عليهن ستر جميع ذلك، هذا وابن مسعود يذكر في معنى الزينة الظاهرة أنها الثياب والرداء، فهو يخالف ابن عباس في قوله الأول لو صح عنه.) **واتە: پێشینان ناكۆك بوونە لەسەر جوانی ڕووكەش ودیاری ئافرەت لەسەر دوو قسە، یەكەم: ئیبنو مەسعود دەڵێت: جوانی بریتیە لە پۆشاك وجل و بەرگ، وە ئیبنو عەباس و هاوڕایانی دەڵێن: بریتیە لەوانەی كە لە رووخسار و دەستەکان دایە، وەکو( کل، وە ئەنگوستیلە)، پێش ئەوەی ئایەتی(حیجاب) دابەزێت ئافرەتان بەبێ (جلباب) ڕۆشتوونەتە دەرەوە، وە پیاوانیش رووخسار ودەستەکانیان دەبینین، وە ئەو کاتە ئاسایی بوو چونکە دەرخستنی ئاسایی بوو، بەڵام پاش ئەوەی خودای گەورە ئایەتی (حیجاب)ی دابەزاند و فەرمووی: (ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی باڵاپۆش خۆیان دابپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و(تووشی گێر و گرفت و کێشە نەبن)، هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو و میهرەبان(لە کەموکوڕی ڕابردووتان خۆش دەبێت). دوای ئەمە ئافرەتان خۆشیان داپۆشیوە لە ئاست پیاوانی بێگانە و نامەحرەم.**

## بۆچوونی هەر چوار مەزهەبەکە

**یەکەم: بۆچوونی پێشەوا ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی:** هێشتا پێشەوای مەزهەبەکە هەندێ لە وتەکانی لەسەری نەوەستاوین لە بابەتی عەورەتی ئافرەت لەدەرەوەی نوێژدا، چونکە هەموو ئەو وتانەی کە گوازراونەتەوە لە بابەتی عەورەتی ئافرەتە لە کاتی نوێژدا یان حوکمی دەرکەوتنی(پێ) و بەشێك لە(قژ، پرچ) لە کاتی نوێژدا.

بەڵام بۆچوونی هاوەڵانی ئەبوحەنیفە (رەحمەتی خودای لێبێت) دوو بەشە:

کە بریتین لە (زانایانی پێشن و زانایانی پاشین(سەردەم )) کە بۆچوونی زانایانی پێشین(سەلەف) دوو جۆرە:

یەکەم: ئافرەت هەمووی عەورەتە جگە لە دەست و دەم و چاوی لەکاتی نوێژ و لەدەرەوەی نوێژ، وەهەروەها دەنگیشیان عەورەتە، بەڵام لەبابەتی(قۆڵ و پێ ولەپی دەست)جیاوازیان هەیە، هەندێکیان بەعەورەتیان زانیوە تەنها لە کاتی نوێژدا، وە هەندێکی تر بەپێچەوانە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەموو ئەم زانایانە ئاگاداریان داوە لە نێوانی ئەوەی رووخساری ئافرەت عەورەت نییە و سەیرکردنی جائیزە، بەو مانایەی کاتێك رووخسار عەورەت نییە مانای ئەوەنییە سەیرکردنی دروست بێت، وە هەروەها یەکدەنگن لەسەر ئەوەی داپۆشینی رووخسار لەکاتی فیتنەدا پێویستە، تەنها ئەوە نەبێت کە ئافرەتێك تەمەنی گەورەیە و بە ساڵاچووە و دڵ ناچێتە سەری[16].

دووەم: پێویستە رووخساری ئافرەت داپۆشرێت لەکاتی هەبوونی بێگانە و نامەحرەم، بەڵام ئەمانە پەیوەستیان نەکردووە بە کاتی فیتنەوە بەڵکو لە هەموو کاتێکدا داپۆشینی بە واجب و پێویست دەزانن[17].

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زانایانی سەردەم یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە واجبە دەم وچاو داپۆشرێت کەچی عەورەت بێت یان نا، چونکە ئەگەر عەورەتیش نەبێت لەبەر فیتنەکە واجب دەبێت کە ئێستا فیتنە لەهەموو کاتێك زیاترە[18].

---

١٦- بروانة: "بدائع الضائع" 5/121–122، و"الاختيار" 1/46، و"فتح القدير" 1/258–260، و"البحر الرائق" 1/284–285، و"رد المحتار" 1/405–406، و"إعلاء السنن" 2/154–155 وغيرها.

١٧- بروانة: "أحكام القرآن" للجصاص 5/245، و"روح المعاني" 22/89، و"إرشاد العقل السليم" 7/115، و"الكشاف" 3/274، و"تفسير النفي" 3/79، و"روح البيان" 7/240 وغيرها.

**دووەم: بۆچوونی پێشەوا مالیك و هاوەڵانی:** هەڵوێستی پێشەوا مالیك(رەحمەتی خودای لێبێت)ڕوونە لە كاتەگشتیەكان جگە لە كاتی نوێژ، تەنها لە نوێژدا نەبێت كە بۆچوون و هەڵوێستی ڕوون نییە و بۆچوونی جیا و قسەی لەسەرە. بەڵام باسی دەرخستنی دەم و چاو لە كاتی پێش دەرچوون لەكاڵ و پاش دەرچوون لە ماڵ بۆچوونی زۆر ڕوونە و هیچ ڕا جیایی و ناكۆكیەك هەڵناگرێ بەوەی بە لایەوە دروست نییە و حەرامە[19] . ئەو قسانەشی كە دەدرێتە پاڵ مالیكیەكان هیچی ڕاست نییە و هەڵبەستراون، چونكە هەر وتەی شەرعزانە مالیكیەكان بەسە و كافییە كە ئەو شتە پاڵدرانەوە بۆیان هەڵبوەشێنەوە. پێشەوا مالیك دەڵێت: (إن كل شيء منها –أي المرأة- عورة حتى ظفرها).[20] واتە: بەڕاستی هەموو شتێك لە ئافرەتدا عەورەتە تاوەكو نینۆكەكانیشی.

## زانایانی مالیكی لەم باسەدا دوو وتەیان هەیە:

یەكەم: هەموو جەستەی ئافرەت لەدەرەوەی نوێژ عەورەتە جگە لە دەم و چاو و دەست، بەڵام بەو مەرجەی كە نەبێتە هۆكارێك بۆ فیتنە، واتا ئەگەر لە دەرەوەی نوێژ رووخسار و دەستی ئافرەت بەدەرەوە بوو و بووە هۆی فیتنە ئەوا بە هیچ شێوەیەك دروست نییە دیاربخرێ و داپۆشینی واجبە، جا لێرەدا شەرعناسە مالیكیەكان هەندێكیان ئەم حوكمەیان تایبەت كرد بە (كچی جوان)، بەڵام لەبەرامبەریدا هەندێكی تر وتیان: پێویستە لەسەر پیاو چاوی بپارێزێت[21].

دووەم: ئەمانە دەڵێن داپۆشینی دەم و چاو بەهەموو شێوەیەك واجبە چ ئەگەر هاتوو فیتنە بوو وە چ ئەگەر فیتنە نەبوو، واتا داپۆشینی دەم و چاو واجبە لە لای بێگانە و نامەحرەم بە گشتی[22].

---

١٨- بڕوانة: "فيض الباري" للكشميري 254/1، و"البحر الرائق" 284/1، و"الفتن" للبيانوني" 196–197، و"فصل الخطاب" 55، و"عودة الحجاب" 421–423.

١٩- وانظر: "التمهيد" 365/6، و"بداية المجتهد" 83/1

٢٠- الموطأ، ص224.

٢١- بڕوانة: لابن العربي 1578/3 – (القوانين الفقهية): 41و( تفسير القرطبي):234/14، هؤلاء فيحب الستر مطلقاً (انظر: "التمهيد" 363/6–369، و"الفواكه الدواني" 152/1، و"حاشية العدوي على شرح الرسالة" 150/1، و"سالك الدلالة" 12–13، و"منح الجليل" 222/1، و"مواهب الجليل" 499/1، و"حاشية الدسوقي" 214/1، و"القوانين الفقهية" 41، و"بلغة السالك" 219/1–220 وغيرها.

٢٢- بڕوانة: "أحكام القرآن، 228/12، و"عارضة الأحوذي" 56/4، و"حاشية الكشاف" لابن المنير 76/3، و"تفسير ابن جزي" 144/3، و"البحر المحيط" 250/7، و"تفسير الميرغني" 93/2، و"أضواء البيان" 586/6، و"المرأة المسلمة" لوهبي الألباني 204–205، و"عودة الحجاب"423/3–426 وغيرها.

**سێیەم: بۆچوونی پێشەوا شافیعی و هاوەڵانی**: بەهەمان شێوە چۆن دەربارەی پێشەوا ئەبو حەنیفە و مالیك وتمان قسەیان لەبارەی عەورەتی ئافرەت کردووە لە نوێژدا، پێشەوا شافیعیش(رەحمەتی خودای لێبێت) بەهەمان شێوە[23]، بەڵام هاوەڵانی وتویانە: ئەگەر مەترسی فیتنەی لێکرا ئەوا واجبە لەسەر ئافرەت دەم و چاوی داپۆشێت، بەڵام ئەگەر مەترسی فیتنەی نەبوو سەیرکردنی ئافرەت بەو مانایەی بەسەیرکردنی هەست و جوڵە و شەهوەتی لێبەدی نەهات ئەوا دەرخستی دەم و چاو دروستە، بەهەما شێوە شافیعیەکانیش دووبۆچونیان هەیە لەم باسەدا:

یەکەم: وتویانە دروستە ئافرەت دەم و چاویان دەربخەن.

دووەم: داپۆشینی دەم و چاو واجبە، ئەمەش کە دەڵێن واجبە پشتیان بە بۆچوونی زۆرینەی پێشینان بەستوە[24].

**چوارەم: بۆچوونی پێشەوا ئەحمەد وهاوەڵانی**: بۆچوونی پێشەوا ئەحمەد(رەحمەتی خودای لێبێت) لەم باسەدا یەکجار بەناوبانگ و ناسراوە تەنانەت بەشێوەیەکی وا کە لە کتێبە فیقهیەکانی مەزهەبی تر نەقڵ کراوە، بەوەی پێشەوا ئەحمەد دەڵێت : (ظفرها عورة، فإذا خرجت، فلا يبين منها شيء ولا خفها، فإن الخف يصف القدم، وأحبّ إليّ أن تجعل لكمها زراً عند يدها لا يبين منها شيء) واتە: نینۆك عەورەتە، وە ئەگەر دەرچوو لە ماڵ نابێت هیچ نینۆکێکی دیاربێت، هەروەها دەربارەی خوف(خف) کە شتێکە وەك(گۆرەویە، یان پێڵاوێکی چەرمی تەنکە) دەڵێت: نابێت دەربکەوێت چونکە وەسفی (پێ) دەکات، وە باشتر و پەسندترە لای پێشەوا ئەحمەد کە ئافرەت بۆ باشتر داپۆشینی دەستەکانی (دەست کێش) بکاتە دەستی، تاوەکو هیچ شتێك لەدەستەکانی دیار نەبن تەنانەت نینۆکەکانیشی[25].

وە شەیخ ولئیسلام ئیبوتەیمییە(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت: (وهو ظاهر مذهب أحمد فإن كل شيء منها عورة حتى ظفرها وهو قول مالك)[26]. واتە: ئەوە بریتیە لە رووکەشی مەزهەبی پێشەوا ئەحمەد کە هەمووشتێك لە ئافرەتدا عەورەتە تەنانەت نینۆکەکانیشی وە ئەوە بریتیە لە قسەی پێشەوا مالیکیش.

---

٢٣- "الأم" 2/85–88.

٢٤- بروانة: "نهاية المحتاج" 6/185–187، و"مغني المحتاج" 3/128–129، و"السراج الوهاج" 360، و"حاشية البيجوري على شرح ابن قاسم على متن أبي شجاع" 2/99–100، و"روضة الطالبين" 7/21، و"الحاوي" 2/167–170، و"حاشية الشرقاوي على تحفة الطلاب" 1/175، و"المجموع" 3/167–169 على أنه في الصلاة فقط، و"إتحاف السادة المتقين" 7/17 وغيرها.

٢٥- "الفروع" لابن مفلح 1/601، 5/154.

٢٦- مجموع الفتاوى – 22 / 110.

**وه هەروەها بۆچوونی هاوەڵانی ڕوونه و هەمان بۆچوونی پێشەوا ئەحمەده که واجبه ئافرەت دەم وچاو وده‌ستی داپۆشێت، بەڵام جیاوازیان هەیه لەسەر دەرخستنی دەم و چاو له کاتی نوێژدا که له دوو بۆچوون پێك دێت، ڕاستەکەی ئەوەیه که واجب نییه لەسەر ئافرەت له نوێژدا دەم و چاوی داپۆشێت** [27] .

٢٧– بڕوانة: ("المغني" 601/1–602، و"الإنصاف" 452/1، و"مطالب أولي النهي" 330/1، و"كشاف القناع" 243/1، و"نيل المآرب" 39/1، و"الآداب الشرعية" 316/1، و"الفروع"601/1، 154/5، و"الصارم المشهور، عودة الحجاب" 429/3–431، وغيرها.

## ڕێنوێنی و هۆشیاریدان

**یەكەم:** شەیخ ولئیسلام ئیبو تەیمییە(ڕەحمەتی خودای لێبێت) كاتێك باسی حیجابی كردووە ئاگادرای لەوە داوە و باس لەوە دەكات كە زۆرینەی زاناكان و شەرعزانان عەورەتی ئافرەتیان لە كاتی نوێژ و كاتەكانی تردا تێكەڵ بەیەكتری كردووە و جیاكاریان لە نێوان نەكردووە.

بۆ نموونە: ئەو شوێن و جێگایانەی پێویستە داپۆشرێت لە كاتی نوێژدا پێویست ناكات لە كاتی تردا داپپۆشرێت، وەكو: داپۆشینی سەر(قژ، پرچ) لە كاتی نوێژ و كاتەكانی هەبوونی كەسی بێگانە و نامەحرەم، لە كاتی نوێژ كردن ئەگەر ئافرەت مەحرەمەكانی خۆشی لە لابێت وەك(برا و مێرد و باوك) ئەوا هەر دەبێت سەری داپۆشێت، بەڵام لە دەرەوەی نوێژ لای مەحرەمەكانی داپۆشینی لەسەر نییە، تەنها لەو كاتە نەبێت كە نامەحرەمێكی لایە.

وە هەروەها نموونەی: دەرخستنی ڕووخسار لە نوێژدا وە داپۆشینی لای نامەحرەم و بێگانەكان. بۆیە پێشەوا ئیبنو تەیمییە هۆشیاری داوە و ڕوونیكردۆتەوە تا خوێندكارانی زانستە شەرعییەكان و توێژەرەكان وریان بن لە هەڵوێست و بۆچوونی زانایان، بە تایبەتی زانایانی سەردەم، كە بەڕاستی مایەی پشت پێ بەستن نین، لەبەر ئەوەی پێویستە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوە ئەسڵیەكە كە گەڕانەوەیە بۆ پێشینان.

**دووەم:** پێویستە لەسەر مرۆڤی ئیماندار بە دوای هەق و ڕاستیدا بگەڕێ جا با لەهەر كوێیەك بێت، وە بەڕاستی شوێن كەوتەبوون و لەدوابوونی تەنها ئەو بۆچوونانەی كە بۆ بەرژەوەندی خۆی باشە ماڵوێرانی و زەرەرمەندییە، بەڵكو دەبێت بەبێ دەمارگیری جەماعی و مەزهەبی و تاكەكەسی سەیری بەڵگە شەرعییەكان بكەین، وە پاشان كامیان بەڵگەی تەواو تر و ڕاست تر بوو شوێن بۆ بەڵگەیە بكەوین، لێرە زێدەتر مەبەستمان ئەوانەیە كە فێرخوازی سەرەتاین و لە شوێن زانستی شەرعییدان، بەڵام خەڵكی عەوام و گشتی ئەوانەی لەدەرەوەی بازنەی گەڕانن بە دوای زانستی شەرعییدا لەسەر ئەوان پێویستە لەدوای ئەو زانایانە بن كە سیقەیان پێیان هەیە و بە ئەهلی عیلم و زانستی دەزانن و دەزانن كەسێكە بەبێ بەڵگە و دەلیل نایەتە قسە، نەوەك بچن بگەڕێن بەدوای قیل و قال و ئەو فەتوایەی سانا و ئاسانە و بەدڵیەتی.

**سێیەم:** چوونە ناو بابەتی حەڵاڵ و حەرام مەترسیدارترین باس و خواسە، هەروەكو پەروەردگار دەفەرمووێ: (وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَذَا حَلَالٌ وَهَذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ) واتە: نەكەن  بە قالەی دەم و زمانتان

بڵێن ئەمە حەڵاڵە و ئەمە حەرامە، بۆ ئەوەی درۆ بەناوی خودا و ئایینی خودا هەڵبەستن،(دیاری کردنی حەرام و حەڵاڵ بەدەست ئێوە نییە)، چونکە بەراستی ئەوانەی درۆ بۆ خودا و ئایینی خودا هەڵدەبەستن سەرفراز و سەرکەوتوو نابن.

**چوارەم:** پێویستە هەردەم جیاوازی بکرێت لە نێوان بۆچوونی(پێشەوای مەزهەب) و شوێنکەوتوانی، یان پێشین و پاشینی سەردەم و وتەی شاز و پشت پێبەستراو لە لای زانایان.

**پێنجەم:** پاش خستنە ڕووی وتە و بۆچوونی هەر چوار مەزهەبەکەی ئیسلام، ئەوەی ڕوونە لامان ئەوەیە کە هەموویان ڕێککەوتوو و یەکدەنگن لەسەر واجب بوونی نیقاب لەکاتی ترس لە فیتنە بەتایبەتی بۆ ئەو (کچ و ژن)انەی کە زیاتر سەرەنج ڕاکێش و جوانن، وە ئەمەش لای هەموومان ئاشکرایە و دەزانین کە ئینکاری لە جوانی ئافرەت ناکرێت، وە هەر یەکێ بانگەشەی ئەوە دەکات کە بڵێ ئەمرۆ ڕووخساری ئافرەت فیتنە نییە ئەوا بەراستی ناراستی وتوە.

**شەشەم:** بەدرێژایی مێژووی ئیسلامی موسڵمانان پابەندبوون بەم پۆشاکە شەرعییەوە، بەڵام دوای هاتنی داگیرکەران بۆ سەر خاکی موسڵمانان ئەم پۆشاك لادان و گۆڕینە ڕووی دا وەك ئەوەی (پێشەوا قورتووبی و ئەبو حەیان و ئیبنو کەسیر) لە تەفسیری ئایەتەکانی حیجاب ئاماژەیان پێکردووە، وە بە شێوەیەکی گشتی یەکەم کەس کە پۆشاکی شەرعی نەهێشت و قەدەغەی کرد (موستەفا کەمال ئەتاتورك) بوو لە تورکیا وە (شانۆگەر سەعد زغلول)یش یەکێکە لە قەدەغەکەرە سەرەتاییەکانی حیجاب و پۆشاکی شەرعی.

**حەوتەم:** ئەگەر باسی شەرعزان و زاناکانی سەردەم بکەین زۆر ئەوانەی کە داپۆشینی ڕووخسار و دەستەکان و هەموو جەستەی ئافرەت بە واجب دەزانن، لەوانە شەیخ (موحەممەد ئەمین شەنقیتی، عەبدولرەزاق عەفیفی، ئەبو بەکری جەزائیری، ئەبو قەتادەی فەڵەستینی، ئەبو موحمەد مەقدسی، وەهبی ئەلبانی، موحەممەد صابونی، موحەممەد ئیسماعیل، عوسەیمین...) گەر بیان ژمێرین لە ژمارە نایەن، بەڵام ئەمانەمان تەنها وەك بەڵگەیەك ئاماژە پێدا.

**هەشتەم:** لەبەرامبەر ئەو زانایانەی دەڵێن ئەم جلە شەرعییە کە بریتیە لە داپۆشینی هەموو جەستە بە ڕووخسار و دەستەکانیشەوە واجبە،بێگومان زانای تر هەن پێچەوانەی ئەم بۆچوونەن، بۆیە دەبینین زۆرێك لە خەڵکی دێن و دەڵێن ئەمە بۆچوونی شەیخ یوسف قەرزاوی و شەیخ ئەلبانی و زانایانی ئەزهەرە، جا با بۆچوونی ئەوانیش بێت!!، هەموو زانایەك هەمقسەی لێوەردەگیرێت وە هەمیش لێی ڕەتدەکرێتەوە.

**نۆیەم:** دەبینین هەندێ کەس ئارەزووی دەرخستنی لاشەی دەکات بە تایەبەتی دەم وچاو لە کاتی فیتنەدا، واتا ئەوەندەی ئارەزوومەندە لە جێگایەکی قەرەباڵغ و پڕ لە فیتنە خۆی دەخات تەنانەت لە ماڵەوەش وا نییە، ئەمەش تەنها ماڵوێرانی دوارۆژی لێدەکەوێتەوە، چونکە وەك عائیشە(رەزای خودای لێبێت) دەفەرمووێ: (لو رأى رسول الله(ﷺ) ما أحدث النساء لمنعهن المسبد كما منع نساء بني إسرائيل) [28]. واتە: ئەگەر پێغەمبەری خودا(ﷺ) ئەوەی ببینیایە کە ئەو ژنانە دەیکەن، ئەوا قەدەغەی دەکردن لە مزگەوت هەروەکو چۆن نەوەکانی ئیسرائیل قەدەغەیان کردن.

**دەیەم:** لەگەڵ ئەوەی زۆرینەی زانایان داپۆشینی رووخسار بە پێویست دەزانن بەڵام ئەگەر لە هەموو کاتێکیشدا پێویست نەبووتەنها لە کاتی فیتنە نەبێت ئەوا هیچ سەردەمێك وەك ئێستا نییە سەبارەت بە فیتنە، شەیخ ئەبو بەکری جەزائیری(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێن: (هذا مع العلم أنه لم يقل أحد من أهل الإسلام بجواز كشف الوجه واليدين عند وجود الفتنة ورقة الدين، وفساد الزمان، بل هم مجمعون على سترهما، كما نقله غير واحد من العلماء) [29]. واتە: ئەوە باش بزانن هیچ یەکێك لە زانایانی ئیسلام دروستیەتی بە دەرخستنی رووخسار و دەستەکانی ئافرەت نەداوە لە کاتی هەبوونی فیتنە و لاوازی شوێن کەوتویی ئایین وە هەبوونی فەساد و بەدڕەوشتی، بەڵکو هەموویان کۆکن لەسەر داپۆشینی، تەنانەت نابینین یەك زاناش غەیری ئەو قسەیەی کردبێت.

## وەڵامی هەندێ لە شوبهە و گومانەکان

- دەڵێن: (الوجه ليس بعورة) واتە: رووخسار عەورەت نییە.

پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ: (إنَّ الناسَ إذا رأوا المنكر فلم يغيّروه أوشك أن يعمَّهم الله بعقاب) [30]. واتە: بەڕاستی خەڵکی ئەگەر خراپە و بێشەرعییەکیان بینی و نەیانگۆڕی ئەوا نزیکە خودای گەورە لەهەموو لایەکەوە سزایان بۆ بنێرێت.

گومانی تێدانییە ئەوانەی (رووخسار عەورەت نییە) بووە بە قسەی سەر زووبان و ژێر زووبانیان ئەوانە بانگەشەکەرانی رووت وقوتی و بێ پۆشاکی و بێ جلی ئافرەتانن، چونکە بێباوەڕان هاتوون لە رووخسارەوە دەستیان پێکردووە، دەشبینین پلانەکەیان سەرکەوت ئێستا داپۆشینی رووخسار شتێکی سەیر و نامۆیە، دەتوانین بڵێن ئێستا ئەو بەناو حیجابانەی هەن

٢٨- البخاري ( 831 ) ومسلم (445) .

٢٩- حراسة الفضيلة 82 .

٣٠- رواه الإمام أحمد بن حنبل في مسنده .

**ئەمانیش تا ڕادەیەك نامۆ و سەیرن لە لای خەڵکی موسڵمان وەك ئەوەی بڵێ ی ئەم خەڵکە موسڵمان نەبن! یان نەزانن خودا فەرمانی داوە بە پۆشتەیی و شاردنەوەی جوانیەکان بۆ خەڵکی بێگانە و نامەحرەم، دەبێت موسڵمانان هۆشیار ببنەوە، دەبیت ووریا ببنەوە لەم شوبهە و گومانە پوچ و هیچە.**

- **دەڵێن: ئایەتی حیجاب تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەر**(صلى الله علية وسلم).

**خودای گەورە دەفەرموویێت:** (وإذا سألتموهن متاعاً فاسألوهن من وراء حجاب) **واتە: خۆ ئەگەر داوای شتێکی پێویستیان(لە خێزانەکانی پێغەمبەر کرد) ئەوا لە پشتی پەردەوە دوایان لێبکەن.**

**وە دەفەرمووێ:** (يا نساء النبي لستن كأحد من النساء.... إلى قوله تعالى: ولا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى) الأحزاب: 32، 33) **واتە: ئەی ژنانی پێغەمبەر(ﷺ) ، ئێوە وەك هیچ ئافرەتێکی تر نین، ئەگەر بەتەواوی ترسی خودا لە دڵ و دەرونتاندایە بە شێوەی ناسك قسە مەکەن، نەوەکو ئەوەی دڵی نەخۆشە بووروژێت و نیازی خراپ ببات، هەمیشە و بەردەوامیش قسەی چاك و بەجێ بکەن(کەهیچ کەس نەتوانێت ڕەخنەی لێبگرێت). ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) لەماڵەکانی خۆتاندا بە سەنگینیەوە بمێننەوە، زینەت و جوانی خۆتان وەکو سەردەمی نەفامی یەکەم(پێشوتر) دەرمەخەن.**

**زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ئەم ئایەتە فەرزبوون و واجب بوونی حیجاب دەسەلمێنێ.**

**عکاشە عبدالمنان (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەربارەی ئەم ئایەتەی تازە باسمانکرد دەڵێت:** (إن هذه الآيات تدل على فرضية الحجاب على المرأة المسلمة غير أن المبطلين لم يروا ذلك فقالوا إنها نزلت في نساء النبي عليه الصلاة والسلام خاصة) **واتە: بەڕاستی ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر فەرزبوون و پێویست بوونی حیجاب لەسەر ئافرەتانی موسڵمان، بەڵام بێدینەکان ئەوەیان بەبینی، بۆیە وتیان: ئەو ئایەتە تایبەت بە خێزانەکانی پێغەمبەر**(صلى الله عليه وسلم) **دابەزیووە.**

**ئێمە لێرە مەبەستمان ئەوەنییە حیجاب بە برگە برگە واجب و فەرزکراوە، نەخێر بەڵکو سەرەتا لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرزکرا، چونکە ئەوان دایکی ئیمانداراننوئەوان لە پێش ترن بۆ ئەوەی بەر فەرمانی پەروەردگار بکەونوجێبەجێی بکەن، چونکە ئەگەر سەرەتا بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فەرزنەکرابا ئەوا لاڕێیان و دوو ڕووانی مەدینە دەیانووت: بۆ ئەو بە خێزانەکانی خۆی نالێت حیجاب بکەن وخۆیان دابپۆشن و وەك سەردەمی**

**جاهیلیەت بە زینەت وجوانیەوە دەرەنچن لە ماڵ. هەر لەبەر ئەوە خودای گەورە سەرەتا لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) حیجابی فەرز کرد، تا دووڕووان و دڵنەخۆشان قسەیان نەمێنێت.**

**ئەبو ئەعلای مەودودی(رەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت:** (نقول لمن يزعم بأن هذه الأحكام تخص نساء النبي اقرأوا بقية الآيات أيمكن أن يكون مراد الله أن يتطهر نساء النبي وحدهن ويطعن الله وحدهن ويقمن الصلاة وحدهن ويؤتين الزكاة وحدهن. فإذا كان هذا غير ممكن، فكيف بالله يكون أمر النساء بالقرار في البيوت ونهيه إياهن عن تبرج الجاهلية والخضوع بالقول خاصاً بنساء النبي وحدهن ما درأ إليهن دون نساء المسلمين؟ وهل هناك دليل معقول تقسم على أساسه الأحكام العامة الواردة في ترتيب وسياق واحد فيكون بعضها خاصاً وبعضها الآخر عاماً؟) **واتە: هەریەکێك پێی وابێت ئەم ئایەتانە تایبەتن بە خێزانەکانی پێغەمبەر(رەزای خودایان لێبێت)، ئەوا پێی دەڵێن: تەواوی ئایەتەکانی تریش بخوێنەوە، دەپرسین و دەڵێین دەبێ خودای گەورە ویستی لەوە بێت کە تەنها خێزانەکانی پێغەمبەر پاك بکاتەوە و هەر ئەوان نوێژبکەن و زەکات بدەن؟!! ئەگەر ئەوە ناگونجێت ونابێت ئەی چۆن دەبێت کە مانەوە لە ماڵ ونوێژکردن و خۆداپۆشین تەنها لەسەر خێزانەکانی پێغەمبەر بێت، بێجگە لە ژنانی موسڵمان!!! ئایا بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو و ڕاست و دروست هەیە لەسەری؟ ئایا دەبێ بڕیارە گشتییە شەرعییەکان دابەشبکرێ بەرێکی و لەهەمان کاتدا هەندێکیان تایبەت بن وهەندێکیشیان گشتی؟!!**

**_دەڵێن: <u>قسەی پێشەوا ئیبنو عەباس(رەزای خودای لێبێت) بە کۆمەڵێك ریوایەت و گێڕانەوە دەهێننەوە لەدەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە</u>** (ولا يبدين زينتهن الا ما ظهر منها) .

**ئەمانە بریتین لە گێڕانەوەکان:**

**گێڕانەوەی یەکەم: بریتیە لە گێڕانەوەی (ئەبو کەریب) دەگێڕنەوە کە ئیبنو عەباس لە تەفسیری ئایەتی** (ولا يبدين زينتهن الا ما ظهر منها) **وتویەتی:** (الكحل والخاتم) **واتە: کل و ئەنگوستیلەیە. لاواز(ضعیف)ە، چونکە لە ڕشتەی گێڕانەوەیدا (موسلیمی مەلائی) هەیە کە کەسێکی زۆر زەعیفە.**

**گێڕانەوەی دووەم: گێڕانەوەی (ئیبنو حەمیدە) کە دەگێڕێتەوە ئیبنو عەباس لەتەفسیری** (ولا يبدين ...) **وتویەتی:** (الظاهر منها الكحل والخدان) **واتە:ئەوە دیارە و دەردەکەوێت تێیدا کل و هەردوو ڕوومەتەکانە. ئەمەش هەر زەعیفە چونکە (ئیبنو حەمید) کەسێکی لاواز و لەڕادەبەدەر فێڵبازبووە، وە (ضوحاکی کوڕی مزاحم) دەڵێت: لە ئیبنو عەباسم نەبیستووە.**

**گێڕانەوەی سێیەم: گێڕانەوەی (عەلی)یە کە ئیبنو عەباس لە تەفسیری ئایەتەکە وتویەتی: (الوجه وكحل العين وخضاب الكف والخاتم) واتە: دەم وچاو و کل و گوستیلە و خەنەی دەستە. ڕشتەی گێڕانەوەی ئەم قسەیەش لاوازە، لەبەر ئەوەی عەلی کوری باوکی ئیبن تەلحە لە ئیبنو عەباسەوە نەیبیستووە.**

**چوارەم: گێڕانەوەی (قاسمە) کە دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەباسەوە لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا وتویەتی: (الخاتم والمسكة) واتە: گوستیلە و بازنی دەستە. ئەمەش ڕشتەی گێڕانەوەکەی لاوازە، چونکە ئیبنو جەریج کە یەکێکە لە گێڕەوەکان لە ئیبنو عەباسەوە گوێبیست نەبووە.**

**پوختەی قسان شەیخ موحەممەد ئەمین لشەنقیتی(ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەڵێت:** (المراد بالزينة ما تتزين به المرأة خارج عن اصل خلقتها ولا يستلزم النظر إليه رؤية شيء من بدنها) **واتە: لەم ئایەتەدا مەبەست لە زینەت بریتیە لەو شتەی کە ئافرەت خۆی پێ جوان و ڕازاوە بکات جگە لە سروشتی ئاسایی خۆیی، وە بۆ سەیرکردن و بینینی ئەو شتانە پێویست ناکات هیچ شوێنێك لە لەشی ببینیت.**

## پوختەی قسان و كورتە تێڕوانینێك

پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە دەربارەی ئافرەتان و ژنانەوە دەفەرمووێ: (ما تركت على أمتي بعدي فتنةً أشد من النساء)[31].

واتە: هیچ شتێك بەجێنەماوە لە دوای من لەسەر ئوممەتم فیتنەی توند بێت لە ئافرەتان زیاتر.

فیتنە لێرەدا بەمانای تاقیكاری دێت واتا ئافرەت هۆكاری تاقیكردنەوەیە بۆ پیاو، خودا بەهۆی ئافرەتانەوە پیاو تووشی تاقیكردنەوە دەكات.

بەسەرەنج دانی ئەو بەڵگانەی لەم نامەیەدا خستمانە بەردەست دەبینین پوختەی قسان ئەمەیە:

★ دەم و چاو و دەستی ئافرەت عەورەتە و واجبە دابپۆشرێت.

★ دەم و چاو و دەستی ئافرەت لە كاتی فیتنەدا عەورەتە.

وەكو زانایانی گەورەی ئیسلام قسەیان لێوە كردووە، هیچ زەمەنێك لە دوای هاتنی ئیسلامەوە وەك ئێستا فیتنە بەربڵاونەبووە، بە جۆرێك ئێستا زۆرێك لە گوناهەكان ئاسایی بۆتەوە لەوانە:

★ ئێستا جگە لە ناپەیوەستان بە ئایین وخوداپەرستی، بەڵكو ئەوانەی پەیوەستن بە ئایین و خوداپەرستیەوە لای ئەوانیش ئێستا شتێكی سانایە ئافرەت(پرچ و قژ)ی دەرخات، بە جۆرێك موسڵمانان و بانگەشەكەرانی ئیسلام بە ئاسایی لەسەر ڕاگەیاندن و كەناڵەكانیان ئەم جۆرە ئافرەتانە نیشان دەدەن، جگە لەوەی برۆ هەڵپاچین و كردن و تاشین زۆر ئاسایی بۆتەوە، جگە لەمە جاری وا هەیە دەبینین بەشێوەیەكی وا ئافرەتی رووت نیشان دەدەن كە سینگ و بەرۆكیان دیارە(پەنا بەخودا).

★ تێكەڵی پیاوان و ئافرەتان، لەوە خراپ تر تێكەڵی كچان و كوڕان تەنانەت لە كارە ئیسلامییەكانیشدا دەبینین كە زۆر ئاسایی كچ و كوڕی لاو هەڵسوكەوت پێكەوە دەكەن و بەكرانەوە و ئایینیشی دەزانن.

---

٣١- متفق عليه.

⋆هاتنەوە ناوەوەی ئافرەتان بۆ ناو کاری بەڕێوە بردن وەك: (دادگاکان و بەرپرسیاریەتی گەورە) کە ئەمەش شتێکی ڕوونە پێغەمبەری خودا(ﷺ) : (لن يفلح قوم ولوا أمرهم امرأة) [32] واتە: سەرکەوتوو نابێت ئەو قەومەی فەرمانیان لەژێر دەستی ئافرەتە و(ئافرەت سەرکردایەتیان دەکات).

ئەمانە چەند شتانێکی بچوکن بە لای ئەوانەوە!!

ئەمانەی بەلایانەوە ئاساییە و بەشەرعی دەزانن ئافرەت و کچانی خەڵکی قژ ڕووت بن و برۆ هەڵپاچرا و سینگ وبەرۆك دیار بن، بەڕاستی ئەوانە ئەگەر کەسانی حافظ قورئانیش بن لە ئیبلیسێك زیاتر نین، بەڵکو لە ئیبلیس ئیبلیس ترن، چونکە ئەمە بانگەشەیە بۆ ڕووت کردنەوەی ئافرەتان و دایکانی موسڵمانان، ئینجا سەرەڕای ئەمە دێن بە ئاین پێمان دەفرۆشنەوە و بە کرانەوە و ئیسلامی ئازاد خواز و دیموکراسی خواز وەسفی دەکەن.

ئێمە پێیان دەڵێین: ئەوەی ئێوەی دروست کردووە باشتر و زاناترە بە مافی بەندەکانی، هەر ئەو دروستکارەشە فەرمانی پێداوین پیاوان و ئافرەتان چاویان لە ئاست یەکتریدا نزم کەنەوە و ئافرەتان جوانی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ ئەوانە نەبێت کە مەحرەمی خۆیەتی.

**کۆتا ووتە:**

پێیان دەڵێین: پێغەمبەری خودا(ﷺ) دەفەرمووێ ئەگەر چوون بۆ داوای ئافرەتێك بۆ جوانی سەیری دەم وچاوی بکەن وە بۆ ناسکی سەیری دەستەکانی بکەن. واتا جوانترین شوێنی ئافرەت رووخسارە وە ناسکترین شوێنی دەستە. بەو مانایەی کە رووخساری ئافرەتت بینی جوانی دەبینی، وە کە دەستیت بینی ئەوا ناسکی دەبینی، باشە ئەوە چ مەنتیقێکە جوانترین و ناسکرین شوێن بەدەرەوە بێت؟!!

عائیشە(ڕەزای خودای لێبێت) دەڵێت: (لقد كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يصلي الفجر فيشهد معه نساء من المؤمنات متلفعات في مروطهن ثم يرجعن إلى بيوتهن ما يعرفهن أحد) [33].

واتە: پێغەمبەری خودا(ﷺ) نوێژی بەیانی کرد و کۆمەڵێك لە ژنانی ئیماندار ئامادە بوون، پاش نوێژ گەڕایاندنیە ماڵەوە بەڵام هیچ یەکێکیانی نەناسی.

ئەم فەرموودەیە زۆر روونە کە ئافرەتاکان رووخساریان داپۆشراو بووە.

---

٣٢- رواه البخاري.

٣٣- رواه البخاري(365) ومسلم (645).

**لە دوا قسەدا دەڵێم: خوشکان و دایکانی موسڵمانان بەڕاستی لەوە گەورەتری و بەرزتری کەسانێکی بێگانە جوانترین و ناسکترین شوێنت ببینن کە دەم و چاو و دەستەکانتە، بەڕاستی هەقیقەت ئەمەیە داپۆشرا بیت بۆ ئەوەی پارێزراو بیت لە چاوان.**

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم

## ناوەڕۆك

